





# بەڕێوەبردنی سەرچاوە مرۆییەکان

ئامادەکردنی

د. سەعد حسێن فتح الله

2015




















# بەڕێوەبردنی سەرچاوە مرۆییەكان

ئامادەكردنی
د. سعد حسين فتح الله

2015












# خشتەی ناوەڕۆک

## Contents

# پوختەیەک لەسەر پرۆژەکە:

بەرفراوانکردنی بەشداریی لە ڕێی کۆمەڵگەی مەدەنییەوە (بەشدارییپێکردن) بریتییە لە پرۆژەی پتەوکردنی بەشداریی کۆمەڵگەی مەدەنی/هاووڵاتی کە سێ ساڵ دەخایەنێت. پرۆژەکە لە لایەن ئاژانسی ئەمریکی بۆ گەشەسەندنی نێودەوڵەتی (USAID) دارایی دەکرێت و لە لایەن ڕێکخراوی مێرسی کۆرپ و یەکێتیی هاوبەشەکانی-ەوە جێبەجێ دەکرێت کە بریتین لە ئینتەرنیوس (Enternews)ی ئەمریکی، بنکەی نێودەوڵەتی بۆ یاسای ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی (ICNL)، ڕێکخراوی دەستەکانی مهیرەبانی (MH) و ڕێکخراوی فریاکەوتنی میللی (PAO).

ئامانجی پرۆژەکە بریتییە لە کارکردن لەسەر سیستەمە دیموکراسییەکان عێراق بەرەو بەشدارپێکردنی زیاتر و چوستیی زیاتر لە ڕێی کاری کۆمەڵگەی مەدەنییەوە بە شێوەیەکی بەردەوام بە مەبەستی قووڵکردنەوەی بەشداریی هاووڵاتیان لە بوارەکانی کۆمەڵایەتی و سیاسییدا. لە سەرجەم قۆناغەکانی پرۆژەکەدا، (بەشدارییپێکردن) جەخت دەخاتە سەر پشتگیریی دەستەپێشخەرییەکان بۆ: بەرفراوانکردنی بەشداریی چالاکی هاووڵاتیان لە پرۆسەی گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی و ئابووری و دیموکراسیی عێراقدا، و پتەوکردنی توانا ڕێکخراوی و دەستگاییەکانی چەند ڕێکخراوێکی سەرەکیی کۆمەڵگەی مەدەنی. هەروەها بە مەبەستی زیاترکردنی کاریگەری کۆمەڵگەی مەدەنی لەسەر دروستکردنی بڕیارەکانی سیاسەتی گشتیی و چاکترکردنی ئەو ژینگە یاسایی و ڕێکخراوی و تواناییەی کە ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی کاری تێدا دەکەن، هەروەها بۆ سوود وەرگرتن لە پسپۆڕی و شارەزایی کۆدەستەیی زیاتر لە نۆ ساڵ کاری ئەو ڕێکخراوانەی لە بواری هاوکاریی مەدەنیی عێراقییەکان کار دەکەن، ئەو عێراقییانەی کە جەنگەکان زیانێکی گەورەی پێگەیاندوون.

# پێشەكی

## 1- ئامانجی ئەم ناميلكەيە

ئەم ناميلكەيە ئەو پرەنسيپ و پێوەرانە لەخۆدەگرێت كە پێويستە لە بوارەكانی بەڕێوەبردنی سەرچاوە مرۆييەكانی دەستگا ئەهلييەكاندا پيادە بكرێت.

ئامانجی رێبەرنامەكە بريتييە لە دابينكردنی ژێدەرێكی چڕوپڕ بۆ دەستگا ئەهلييەكان سەبارەت بە سياسەتەكان و رێوشوێنە كارگێڕييەكانی سەرچاوە مرۆييەكان وەك رێنمايی بۆ كار و ئاكاری دەستگاكە لە هەمبەر سەرچاوە مرۆييەكانيدا. هەروەها وەك ناميلكەيەك بۆ باشترين شێوازەكانی بەڕێوەبردنی كاروباری فەرمانبەران. بايەخی مرۆڤ وەك كارمەند لەوێدايە كە بنچينەی چالاكييە بەرهەمهێنەكان و پێكهاتەی ئابووری دەستگاكانە.

دەستگاكان لەو بارەيەوە كاريان كردووە بۆ پێشخستنی پرۆسە و سياسەتەكانی بەڕێوەبردنی سەرچاوە مرۆييەكان و ئەو سياسەتانەی بۆ ئەو مەبەستە پيادەی دەكەن. ئەمەش لە پێناو هەبوونی پەيكەربەندييەكی سيستماتيك و زانستی و پراكتيكی كە هاوكاری رێكخراوەكەيان بكات لە بەديهێنانی پرەنسيپ و ئامانجەكانيدا. بەڕێوەبەری دەستگاكە لەسەر پێشنياری ئەنجومەنی كارگێڕی، ئەم سياسەتانە پيادە دەكات. پێويستە

سالآنە یان دوو سالْ جارێک دەستگاکە پێداچوونەوەی ئەم ڕێنماییانە بکات بۆ جەختکردنەوە و پێوانەکردنی سەرکەوتنیان و بۆ زیادکردنی خالْ و کاروباری نوێ ئەگەر پێویست بوو.

**ناميلكەی سەرچاوە مرۆییەکان تەواوکەری ناميلكەی کارگێڕییە،**

وا پەسەندە بە شێوەیەکی تەریب کار لەسەر ئەم دوو ناميلكەیە بکرێت چونکە ئەو ناميلكەیە ستراتیج و سیاسەتەکانی سەرچاوە مرۆییەکان دەبەستێتەوە بە سیستمی کاری یاسایی و کارگێڕیی کاروباری بەڕێوەبەرایەتیی سەرچاوە مرۆییەکان.

## ئەم ناميلكەیە:

1. ڕێوشوێنەکانی دامەزراندن لەخۆدەگرێت لەسەر بناغەی دەرفەتی یەکسان و کێبڕکێی ڕێکوپێک و پاک.
2. پرەنسیپی بەڕێوەبردنی باش، پتەو دەکات و جەخت دەخاتە سەر بایەخی هەڵسەنگاندن و بەشداریکردن سەرەڕای هاندان بۆ دامەزراندنی سیستمی هەڵگرتنی زانیارییەکانی کارمەندانی دەستگاکە.
3. وەک ڕێبەرێکی نووسراو و روون و ڕاگەیاندراو، یەکێکە لەو شێوازانەی بەکاردەهێنرێت بۆ جەختکردنەوە لە شەفافییەتی دەستگاکە.

## بەکارهێنانی ئەم ناميلكەیە

ئەم ڕێبەرە وەک ژێدەرێک بەکاردەهێنرێت بۆ کاری دەستگاکە، و دەتوانرێت وەک پێویست بۆ ڕێنمایی پەنا ببەیت بۆ بەشەکانی.

ئەم ڕێنماییە ڕێنماییەکی یەکخراوە و دەتوانرێت بۆ سەرجەم دەستگا ئەهلییەکان بەکاربهێنرێت بە هەندێک دەستکاریی تایبەت بە هەر دەستگایەکەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ تواناکان و قەبارەکەی بگونجێت.
پێویستە دەستگاکان ناوبەناو بگەڕێنەوە بۆ ئەم ڕێنماییە، بۆ ئەوەی بزانن تا چەند گونجاوە و تا چەند دەتوانرێت پیادە بکرێت، یان تا چەند پێویستی بە دەستکارییە بە گوێرەی ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەر ڕێکخراوەکە یان ژینگەکەدا هاتووە.

**ئەم ناميلكەيە بۆ چەند بەشێك دابەش دەبێت** و هەر بەشێک ڕێوشوێنی تەواو و پێویستی تێدایە لەسەر بابەتەکەی بۆ ئەوەی بتوانرێت بە شێوەیەکی کارا بەکاربهێنرێت لە لایەن دەستگاکەوە. هەروەها بە تێروتەسەلی باسی پرۆسەکان و ڕێوشوێنەکانی هەر چالاکییەک و کەسی بەرپرس لە جێبەجێکردنی، دەکات.

**ئامانجی ئەم ناميلكەيە بە گشتیی** ئەو کارمەندانەیە کە لە دەستگا ئەهلییەکان کار دەکەن، و بە تایبەتییش کارمەندانی بەڕێوەبەرایەتیی کاروباری فەرمانبەران.

**ئەم ناميلكەيە ئامرازێکی زیندووە** و دەتوانرێت دوای ڕەزامەندیی ئەنجومەنی کارگێڕی، پیادە بکرێت.

# سەبارەت بەڕێوەبەرایەتیی سەرچاوە مرۆییەکان

- **بەڕێوەبردنی سەرچاوە مرۆییەکان و پێناسەکانی:**

بەڕێوەبردنی سەرچاوە مرۆییەکان چەندین پێناسەی هەیە، وەک:

١. بەڕێوەبردنی سەرچاوە مرۆییەکان بریتییە لەو بەڕێوەبەرایەتییەی کە بڕوای وایە کارمەندانی بواری چالاکییە جۆراوجۆرەکانی دەستگاکە بریتین لە گرنگترین سەرچاوە و پێویستە کار بکرێت بۆ ئەوەی هەموو ئامرازێکیان بۆ دابین بکرێت تا بتوانن بە باشترین شێوە کارەکانیان ئەنجام بدەن، بۆ بەرژەوەندی دەستگاکە و بۆ بەرژەوەندی کارمەندان خۆیان، و چاودێرییان بکرێت و وەک پێویست هاندەریان پێشکەش بکرێت بە مەبەستی جەختکردنەوە لە سەرکەوتنی ئەوانیش و دەستگاکەش بە گشتیی.

٢. بەڕێوەبردنی سەرچاوە مرۆییەکان بریتییە لە زنجیرەک بڕیاری تایبەت بە پەیوەندییە وەزیفییە کاریگەرەکان لەسەر کارایی دەستگاکە و کارمەندەکانی.

٣. بەڕێوەبردنی سەرچاوە مرۆییەکان بریتییە لە پرۆسەی هەڵبژاردن و بەکارهێنان و گەشەپێدان و قەرەبووکردنەوەی سەرچاوە مرۆییەکانی دەستگاکان.

بەڕێوەبردنی سەرچاوە مرۆییەکان دابەش دەبێت بۆ چوار بەشی پێکەوە گرێدراو، کە بریتین لە پلاندانان، ڕێکخستن، ڕێنمایی، و چاودێری کارمەندان بە مەبەستی گەشەپێدان و قەرەبووکردنەوە و پارێزگاریکردنیان بە مەبەستی بەدیهێنانی ئامانجەکانی دەستگاکە.

- **هۆیەکانی سەرهەڵدانی بەڕێوەبردنی سەرچاوە مرۆییەکان:**

هۆی سەرهەڵدانی بەڕێوەبردنی سەرچاوە مرۆییەکان دەگەڕێتەوە بۆ بەرفراوانی و گەشەسەندنی پیشەسازی کە لە سەردەمی نوێدا ڕوویدا، ئەمە بووە مایەی سەرهەڵدانی ڕێکخراوە جیهانییەکان، و ئنجا گیروگرفت و ناکۆکی سەری هەڵدا لە نێوان کارگێڕی و سەرچاوە مرۆییەکان. کارگێڕی هەوڵی داوە شێوازی ڕووبەڕوو بوونەوە بەکاربهێنێت بۆ چارەسەری گرفتەکە، بەڵام ئەمە نەیتوانی ڕێگە بگرێت لە سەرهەڵدانی کارگێڕییەکی تایبەت بە سەرچاوە مرۆییەکان و چارەسەرکردنی گرفتەکانی.

هەروەها، بەرفراوانبوون و زیادبووونی دەرفەتی خوێندن و ڕۆشنبیری گشتیی سەرچاوە مرۆییەکان، بووە مایەی زیادبوونی هۆشمەندیی دەستی کار، و ئیتر پێویست بوو خەڵکانێک هەبن کە پسپۆڕ بن لە بەڕێوەبەرایەتیی سەرچاوە مرۆییەکان و دۆزینەوەی ئامرازی نوێ بۆ کارکردن لەگەڵ ئەم جۆرە سەرچاوە مرۆییە.

هۆیەکی تریش بریتی بوو لە زیادبوونی دەستێوەردانی حکومەت لە پەیوەندییەکانی نێوان کرێکار و خاوەنکار لە ڕێی دەرکردنی هەندێک یاساوە بۆ ئەوەی دەستگاکان ڕووبەڕووی گرفت نەبنەوە لەگەڵ حکومەت چونکە نەیاندەویست پابەند بن بەم یاسایانەوە. هەروەها سەرهەڵدانی سەندیکا و ئەو ڕێکخراوە جیهانییانەی بەرگری لە سەرچاوە مرۆییەکان دەکەن هۆیەکی تر بوو. بەم شێوەیە، دەبوو کارگێڕییەکی تایبەت هەبێت بۆ دروستکردنی کەشی هاوکاریی کارا لە نێوان کارگێڕی و ڕێکخراوە جیهانییەکان، و داڕشتنی سیاسەتی نوێ بۆ

ئەم پەیوەندییانە. دواجار، سەرهەڵدانی یاسا و ڕێسای تایبەت و گرنگ سەبارەت بە میدیا و ڕێکخراوە ناوخۆییەکان لە عێراق و بایەخی بەشداریکردن و ڕاوێژ هەندێک لەو هۆیانەن کە بەڕێوەبەرایەتیی سەرچاوە مرۆییەکان سەری هەڵدا.

هەروەها بۆ ڕێکخستنی کار لە دووتوێی دەستگاکان بە مەبەستی زیادکردنی کارایی دەستگاکانو پتەوکردنی شەفافییەت و زیاترکردنی هەستی ئینتیما لەلای کارمەندەکان بە شێوەیەک کە مافەکانیان پارێزراو بێت و پابەندێتییەکانی دەستگا قازانج-نەویستەکانی عێراق بێتە دی.

- **گەشەسەندنی چەمکی بەڕێوەبەرایەتیی سەرچاوە مرۆییەکان**

یەکەم: قۆناغەکانی گەشەسەندنی چەمکی بەڕێوەبردنی سەرچاوە مرۆییەکان پەیوەستە بەو زاراوەیەی لەلایەن ڕێکخراوەکانەوە بەکارهێنراوە بۆ ئاماژەدان بۆ وەزیفەی کەسی بەرپرس لە بەڕێوەبردنی کاروباری کارمەندان. ئەم زاراوەیە تا ڕادەیەک ئەم شێوازانەی خوارەوەی هەبووە بە گوێرەی زنجیرەبەندیی کات:

- سەرۆکی فەرمانبەران
- بەڕێوەبەری فەرمانبەران
- بەڕێوەبەری کاروباری کۆمەڵایەتی
- بەڕێوەبەری سەرچاوە مرۆییەکان.

وەک وەسفێک بۆ ئەو رۆڵەی کە بەرپرس یان بەڕێوەبەری سەرچاوە مرۆییەکان دەیبینی کە کاری لەسەر پێویستییەکانی دەستگاکە و کارمەندەکان دەکرد. بەڵام ئەم پۆلێنە کورت و پوختەیە، چونکە دەشێت بەرپرسی کارمەندان بایەخ بە کاروبارە مرۆییەکانیش بدات.

**دووەم** :لە ئەنجامی هەندێک لێکۆڵینەوەوە گۆڕانکارییەکی بەرفراوان ڕووی دالە ناوەڕۆک و پیشەی بەڕێوەبەرایەتیی کاروباری کارمەندان، بە تایبەتی لە بواری ئامانج و سیاسەتەکاندا. تەرخانکردنی سیستمی کارگە بووە هۆی سەرهەڵدانی پێویستبوونی زانست و مومارەسەی تایبەت بە سەرچاوە مرۆییەکان، بە تایبەتی کاتێک پەیوەندییەکانی کار و کارمەندان ئاڵۆزییەکی زۆری بەخۆیەوە بینی. ئەمەش بە تایبەتی لە پاش شۆڕشی پیشەسازی و سەرهەڵدانی ئامێر و کۆمەڵگەکان هاتە ئاراوە.

**سەبارەت بە گەشەی چەمکی بەڕێوەبردنی سەرچاوە مرۆییەکان، ئەم خاڵانەی خوارەوە شایانی سەرنجن:**

- شۆڕشی پیشەسازی.
- سەرهەڵدانی بزاڤە جیهانییەکان و یەکێتی و سەندیکاکان.
- سەرهەڵدانی بەڕێوەبردنی بیرۆکە زانستییەکان.
- سەرهەڵدانی زانستی پەیوەندییە مرۆییەکان.
- سەرهەڵدانی هەندێک پسپۆڕ لە بواری بەڕێوەبردنی سەرچاوە مرۆییەکان.
- بایەخ و ئامانجەکانیبەڕێوەبەرایەتیی سەرچاوە مرۆییەکان.

بــــايەخی ســـــەرچاوە مرۆييەكـــان لێـــرەدايە: (بايەخـــدان بە ســـــەرچاوە سەرەكييەكانی دەستگاكە، كە خەڵكەكەيە، و بەرفراوانبوونی دەستگاكان و فرەبوون و جۆراوجۆريێتی پيشەكان و زيادبوونی ژمارەی كارمەندان و ئاڵۆزبوونی پەيوەندييەكانی نێوان فەرمانگە جۆراوجۆرەكانی هەمان دەستگا، و گەشەسەندنی پسپۆڕی كارزانی كارمەندەكان، و دانانی پلانی تـــايبەت بە مەشــــقكردن، و لێكـــۆڵينەوە لە گرفتـــی كارمەنــــدان و چارەسەركردنيان، و هەڵبژاردنی كەسی گونجاو بۆ پۆستی گونجاو و هەروەهـــا دانـــانی بەردی بنـــاغەيەكی دادپەروەرانەی پيشــــەيی بـــۆ هەڵسەنگاندنی كارمەندەكان"

**<u>ئامانجەكانی بەڕێوەبەرايەتيی سەرچاوە مرۆييەكان بريتين لە چۆنايەتی، و كارايی:</u>**

1- چۆنـــايەتی، و چـــاكتركردنی چۆنـــايەتی: راكێشـــانی ئەو ســـــەرچاوە مرۆييانەی كە دەتوانن ئامانجەكانی دەستگاكە بهێننە دی، و كاركردن بۆ هەڵبژاردنيان و ناساندنی دەستگاكە بە شێوەيەكی گونجاو تا ئەو كەسانە ڕابكێشێت كە بۆ كار دەگەڕێنبۆ ئەوەی بێنە ريزی ستافی دەستگاكە.

<u>هێشـــتنەوەی كەســـانی ســـــەركەوتوو لە پرۆســـــەی هەڵبژاردنــــدا، و سەقامگيريی دەستی كار لەناو دەستگاكاندا.</u>

2- كارايی: واتە دەستی كار بتوانێت بە سەركەوتوويی ئەو كارانە بكات كە داوای لێ دەكرێت. كارايی پەيوەستە بە چەند فاكتەرێكەوە: هاندانی كەســـەكان، پێشخســـتنی تواناكانيـــان، يارمەتيـدانيان بـــۆ بەدەســـتهێنانی پسپۆڕی و شارەزايی نوێ و هاوكارييان بۆ ئەوەی بگەنە ئەو ئاستەی حەزيان لێيە.

2- ئەرکەکانی بەڕێوەبردنی سەرچاوە مرۆییەکان

هەندێک لە گرنگترین وەزیفەکانی سەرچاوە مرۆییەکان بریتین لە:

- **لێکۆڵینەوە لە پێویستییەکان:**

لێکـۆڵینەوە لە پێویسـتییەکان بە بەشـداریی بەڕێـوەبەری گشـتیی و بەڕێـوەبەری بەشـەکان و بەڕێـوەبەری دارایـی. بەڕێـوەبەرایەتی سەرچاوە مرۆییەکان کار دەکات بۆ ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەیەکی ساڵانە بـۆ دیـاریکردنی پێویسـتییەکانی دەسـتگاکە بـۆ وەزیـفەی نـوێ بە ڕەچـاوکردنی پێویسـتییەکانی فەرمـانبەران، و پرۆسـەی ئـاڵوگۆڕ و ئاوێتەکردنی وەزیفەکان. پێویستە ئەم پێوەرانە ڕەچاو بکرێن:

أ. هەبـوونی بـودجەی پێویسـت بـۆ داپۆشـینی وەزیـفەکە، و دەستنیشـانکردنی ئەو پـرۆژەیەی کە ئەم خەرجیـیەی دەکەوێـتە سەر.

ب. هەبـوونی پێویسـتییەکانی وەزیـفەکە وەک ئـسـوڵی چەسـپاو و شوێنی گونجاوی کار.

ج. دەستنیشانکردنی سروشتی پێویستیی بەرنامەکە یان پرۆژەکە بە وەزیفەیەکی نوێ، یان بۆ هەڵوەشاندنەوەی وەزیفەیەک، یان بۆ ئاوێتەکردنی هەندێک وەزیفە.

د. ئامادەکردنی ڕاپرسـی بـۆ لێکـۆڵینەوە لە پێویسـتیی کارمەنـدان بە مەشق.

## شیکردنەوەی وەزیفە

بەڕێوەبەری بەشەکە (ئەو فەرمانگەیەکی بەشێکە لە ڕێکخراوەکە) بە هاوکاری بەڕێوەبەری گشتیی لیستەیەک ئامادە دەکات بەو وەزیفانەی کە تازەن لە دەستگاکە، لەگەڵ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی لەسەر چالاکی و ئەرکەکانی هەر وەزیفەیەک و بەرپرسیارێتییەکانی سەرشانی کارمەندەکە. سەرەڕای مەرجەکانی خۆپالاوتن بۆ وەزیفەکە.

ئەگەر وەزیفەکە پێشتر هەبوو ئەوسا سالانە پێداچوونەوەی (وەسفی وەزیفی) و مەرجەکانی وەزیفەکە دەکرێت، و ئەگەر پێویست بکات ئەوا بە بەشداریی بەرپرسی فەرمانگەکە و بەڕێوەبەری گشتیی، گۆڕانکاری تێدا دەکرێت.

ئەگەر پێویست بکات وەزیفەیەکی نوێ دابمەزرێت ئەوسا بەڕێوەبەری فەرمانگەکە داواکاریی بۆ کارگێڕی بەرز دەکاتەوە و "وەسفی وەزیفی" لەگەڵ هاوپێچ دەکات بۆ ڕوونکردنەوەی هۆی داواکردنی ئەم وەزیفە نوێیە.

## ڕاگەیاندنی وەزیفەکە و پێداچوونەوەی داواکارییەکان:

بۆ پاراستنی پرەنسیپی نەزاهە و بۆ جەختکردنەوە لە پرەنسیپی یەکسانی، پێویستە وەزیفەکانی دەستگاکە ڕابگەیەندرێت و بڵاوبکرێتەوە. واتە دەرفەتی پێشکەشکردن بۆ وەزیفەکە بۆ هەموان بە یەکسانی بێت، وا باشترە لە ڕۆژنامە ناوخۆییەکان و لەسەر ویبسایتی ڕێکخراوەکە بڵاو بکرێتەوە، ئەگەر هەبێت. بەڵام وا باشترە یەک شێواز بەکاربهێنرێت بۆ وەرگرتنی داواکارییەکان، یان بە فاکس یان بە ئیمەیڵ.

یاریدەدەری کارگێڕی دەسەڵات بە کەسێک دەسپێرێت بۆ ئەوەی لە جیاتی ئەم، فۆرمی داواکاری وەربگرێت. وا باشترە ئەرکەکە بە یەک کەس بسپێرێت. کارمەندانی دەستگاکە بۆیان هەیە فۆرم پێشکەش بکەن بۆ ئەو پۆستانەی ڕادەگەیەنرێت ئەگەر مەرجەکانیان تێدا بێت، و دەبێت بە بێ لاگیری و جیاکاری بچنە کێبڕکێ لەگەڵ ئەوانەی تر کە فۆرمیان پێشکەش کردووە.

لیژنەیەک، کە بە لای کەمەوە لە دوو کەس پێک دێت، کە یەکێکیان بەڕێوەبەری فەرمانگەکەیە (واتە بەڕێوەبەری بەشەکەیە لە ڕێکخراوەکە)، پێداچوونەوەی سەرجەم داواکارییەکان دەکەن و لیستێک ئامادە دەکەن بە ناوی ئەو هەشت کەسەی کە باشترین پاڵێوراون. دەبێت سەرجەم داواکارییەکان لە فایلێکی تایبەت بەو پۆستەدا هەڵبگیرێن.

## پرۆسەی تاقیکردنەوە (لە کاتی چاوپێکەوتندا)

لیژنەیەک پێک دەهێنرێت کە بە لای کەمەوە سێ کەسن، بەڕێوەبەری فەرمانگەکە و بەڕێوەبەری کارگێڕی و کەسێکی تر کە شارەزای لایەنە تەکنیکییەکانی پۆستەکە بێت.

وا پەسەندە بانگهێشتی هەشت کەسەکە بکرێت بۆ ئەوەی بە نووسین تاقیکردنەوە بکەن، بۆ زانینی ئاستی مەعریفی پاڵێوراوەکە لەسەر وەزیفەکە، لیژنەکە پرسیارەکان و باشترین وەڵامەکان ئامادە دەکات، و ئنجا ئەدای پاڵێوراوەکان تاقی دەکاتەوە.

دەبێت لیژنەکە زۆر توانادار و بابەتییانە بێت، واتە نابێت پێکدادانی بەرژەوەندی هەبێت لە نێوان ئەندامانی لیژنەکە و ئەو کەسانەی تاقی دەکرێنەوە.

لیژنەکە بانگی پێنج لە پاڵێوراوەکان دەکات بە گوێرەی ئەنجامی تاقیکردنەوەکە. فۆرمی هەڵسەنگاندنی چاوپێکەوتن ئامادە دەکرێت، و بۆ هەر پێنجیان هەمان فۆرم بەکاردەهێنرێت، بۆ ئەوەی هەمان پێوەری دیاریکراو و روون بۆ هەموویان بەکاربهێنرێت. سێ ئەندامی لیژنەکە ئامادەی دیمانەکان دەبن: بەڕێوەبەری فەرمانگەی پەیوەندیدار (واتە بەڕێوەبەری بەشەکە لە رێکخراوەکە)، بەڕێوەبەری کارگێڕی، و کەسێک کە پسپۆڕە لە بوارە تەکنیکییەکانی پۆستەکەدا. ئنجا پرۆسەی دیاریکردنی یەکەم ئەنجام دەدرێت، کە دوایین ڕاپرسییە لەسەر ئەو پاڵێوراوەی خۆی بۆ کاری وەزیفەیی یان خۆبەخشی پاڵاوتووە لە رێکخراوەکە.

## دارِشتنی سیستمی مووچە و پلەی وەزیفی

پێویستە مووچە بۆ وەزیفەکان دیاری بکرێت و هێندەی پێویست بایەخی پێبدرێت واتە سیستمی مووچەکە گونجاو بێت و بابەتییانە بێت لەگەڵ بەها و بایەخی پۆستە جۆراوجۆرەکانی ناو رێکخراوەکە. وا پەسەندە وەک پرەنسیپێکی بەڕێوەبردنی باش کە لای کەمی مووچەکان دیاری بکرێت، و جیاوازییەکی گەورە نەبێت لە بڕی مووچەکاندا بۆ ئەوەی کارمەندان دڵسۆزییان بۆ رێکخراوەکەیان هەبێت.
پێویستە سیستمی مووچە و پلەی وەزیفی بە گوێرەی شایستەییەکان و کارزانییەکان دابڕێژرێت وەک ئاستی خوێندن و پسپۆڕیی زانستی. پێویستە دەستگاکە کار بە یاسای کار و رێنماییەکان بکات، وەک لای کەمی مافی فەرمانبەر.

## دارِشتنی سیستمی هاندان (الحوافز):

پرۆسەی هاندان (حەوافز) پشت بە خەڵاتکردنی ئەدای نایاب دەبەستێت، ئنجا تاکەکەس بێت یان کۆمەڵ، لە رێی سیستمی هاندانی تاکەکەسییەوە. بە گوێرەی "هەڵسەنگاندنی ئەدای تاکەکەس و سیستمی حەوافزی کۆ، سەرەڕای بەخشینی حەوافز لەسەر بناغەی ئەدای گشتیی دەستگاکە بە شێوەیەک کە وەڵامی پێویستییەکانی فەرمانبەران بداتەوە لە دووتوێی بەدیهێنانی ئامانجەکانی دەستگاکە.

هەروەها وا پەسەندە دڵنیایی کۆمەڵایەتی و تەندروستی بدرێت بە کارمەندان، سەرەڕای هەندێک خەسڵەتی تری وەک دڵنیایی بۆ نەخۆشی و قەرزی بێ سوود، و خزمەتگوزاریی تر.

## هەڵسەنگاندنی ئەدا

بەڕێوەبردنی سەرچاوە مرۆییەکانی هەر دەستگایەک ئەرکی هەڵسەنگاندنی ئەدای فەرمانبەران لە ئەستۆ دەگرێت. ئەم هەڵسەنگاندنە سێ مەبەستی هەیە: ئاگاداریی لە شایستەی و کارزانی ئەدای فەرمانبەر، دووەم: زانینی کەموکوڕییەکان لە ئاستی ئەدا، ئەمەش بە هەماهەنگی لەگەڵ بەرپرسی ڕاستەوخۆی فەرمانبەرەکە. و سێیەم: دەستنیشانکردنی حەوافزی ساڵانە کە فەرمانبەرەکە شایستەیەتی بە مەبەستی پێکەوە گرێدانی ئەنجامی هەڵسەنگاندنەکە لەگەڵ زیادکردی ساڵانە بەو شێوەیەی رێکخراوەکە بڕیاری لەسەر دەدات.

پێویستە لە پرۆسەی هەڵسەنگاندندا تاوتوێ لەگەڵ فەرمانبەرەکە خۆی بکرێت، بۆ ئەوەی باشترین ئەنجامی هەبێت هەڵسەنگاندنەکە و ئامانجە

بنەڕەتییەکەی خۆی بپێکێت، کە بریتییە لە هاندانی کارمەند بۆ ئەدای باشتر و دۆزینەوەی ئەو بوارانەی کە پێویستە ئەدای خۆی باشتر بکات.

## مەشق و گەشەپێدانی کارگێڕی

ئامانج لە مەشق و گەشەپێدانی کارگێڕی بریتییە لە بەرزکردنەوەی ئاستی کارمەندان لە ڕێی گەشەپێدانی شارەزایی و کارزانییەکانەوە، و گەشەپێدانی لایەنە ئەرێنییەکانیان. مەشق تەنها جەخت ناخاتە سەر گەشەپێدانی ئەدا، بەڵکو هەروەها چاکترکردنی ئاکاری کارمەند لە ڕێی ئەداوە.

لە ڕێی تاوتوێ لەگەڵ کارمەندەکان بۆ دیاریکردنی پێویستییەکان لە مەشق و ڕاهێنان، یان لە ڕێی ڕاپرسییەکەوە، و بە گوێرەی بودجەی ڕێکخراوەکە و سەرچاوە بەردەستەکان، پێویستە پلانێکی ساڵانە ئامادە بکرێت بۆ گەشەپێدانی کادرەکان.

## بەڕێوەبردنی مۆڵەتی ساڵانە و مۆڵەتی نەخۆشی

بە گەڕانەوە بۆ ڕێنمایی کارگێڕی، و بە گوێرەی ئەوەی کە یاسای کار لای کەمی مافەکانی مۆزەف دەپارێزێت، بەڕێوەبەرایەتی سەرچاوە مرۆییەکان، کارمەندان ئاگادار دەکاتەوە لە سەرجەم مافەکانیان و ئەو مۆڵەتانەی کە شایستەن وەریبگرن.

ئەم بەڕێوەبەرایەتییە هەروەها زانیاری لەسەر شایستەیی فەرمانبەران بۆ مۆڵەت هەڵدەگرێت و تۆماری دەکات لەناو سیستەمی کۆمپیوتەر بە

ئەکسـل (بە گـوێرەی توانـای ڕێکخـراوەکە)، و نـوێکردنەوەی ئەم داتـایە ناوبەناو.

پێویسـتە فەرمـانبەر بە چەنـد ڕۆژێـک پـێش ڕۆژی مـۆڵەتەکە، داواکـاری پێشکەش بکات، ئەگەر مۆڵەتەکە دوو ڕۆژ زیاتر نەبوو. ئەگەر زیاتر بـوو، ئەوسا پێویستە بە لای کەمەوە پێش هەفتەیەک پێشکەشی بکات.

سـەرەڕای ئەمـانەش، بەڕێـوەبەرایەتی سـەرچاوە مرۆییەکـان فایلێـک بـۆ هەر کارمەندێک ئامادە دەکات کە ئەم زانیارییانەی تێدایە:

أ. وێنەی بڕوانامەی فەرمیی فەرمانبەر، پەیمانگە، زانکۆ، کۆلیژ، تاد.

ب. وێنەی ناسنامەی فەرمانبەر.

ت. وێنەی حسابی بانک، ئەگەر هەبێت.

ث. وێنەی کەسیی فەرمانبەرەکە.

ج. وێنەی سی ڤی.

ح. گرێبەستی کارەکەی.

خ. داواکارییەکان بۆ وەرگرتنی مۆڵەت.

د. ئاگادارکردنەوە (ئینزار) و سەرنجڕاکێشان.

ذ. هەڵسەنگاندنی ئەدای فەرمانبەرەکە.

ر. هەر بەڵگەنامەیەکی تر، دڵنیایی تەندروستی، قەرز، هتد

ئەمانەی سەرەوە سـادەن و هەمـوو دەسـتگایەک دەتوانێت ئەو پرۆسـەیە جێبەجـێ بکـات. شـایانی سـەرنجە، ئەگەر بەڕێـوەبەری بەڕێـوەبەرایەتی سـەرچاوە مرۆییەکـان لەوێ نەبێـت. ئەوسـا بەڕێـوەبەری کـارگێڕی ئەرکەکـانی لە ئەسـتۆ دەگرێـت، ئەگەر بەڕێـوەبەری کـارگێڕییش لەوێ نەبوو ئەوسا بەڕێوەبەری گشتیی.

## 4. ڕێوشوێنەکان

**ڕێوشوێنەکان چەند زانیارییەک لەخۆدەگرن، وەک:**

| ڕێوشوێن | |
|---|---|
| ا- ناوی ڕێوشوێن: ڕێوشوێنی کار | ل:1 |
| ژمارەی ڕێوشوێن: 1 | لە:1 |

| ژ | هەنگاوەکان |
|---|---|
| 1. | بەرپرسی سەرچاوەکان، چالاکی و ئەرکەکانی وەزیفەکانی ناو ڕێکخراوەکە پێناسە دەکات ناوبەناو و ئەگەر پێویست بوو. |
| 2. | هەروەها "وەسفی وەزیفی" دادەڕێژێت بۆ وەزیفەکان |
| 3. | ئەرکەکان و بەرپرسیارێتییەکانی پۆستەکە دەستنیشان دەکات، واتە وەسفی وەزیفی. |
| 4. | خەسڵەتەکانی کەسی شایستە و خاوەنپسپۆڕی و مەشق بۆ وەزیفەکە دەستنیشان دەکات. |
| 5. | بەرزی دەکاتەوە بۆ بەڕێوەبەری کارگێڕی، بۆ پێداچوونەوەی. |
| 6. | بەڕێوەبەری کارگێڕی لای خۆیەوە بەرزی دەکاتەوە بۆ بەڕێوەبەری گشتیی، بۆ وەرگرتنی ڕەزامەندی، و ئەمیش لەلای خۆیەوە بەرزی دەکاتەوە بۆ ئەنجومەنی کارگێڕی بۆ متمانەپێدانی. |
| 7. | ئەنجومەنی کارگێڕی متمانە بە وەسفە وەزیفییەکە و خەسڵەتەکانی کەسی گونجاو بۆ پۆستە باڵاکانی کارگێڕی دەدات، یان دەستەی کارگێڕی بۆ پۆستەکانی تر. |

| وەسفی ڕێوشوێن | |
|---|---|
| ب: ناوی ڕێوشوێن: پلاندانان بۆ سەرچاوە مرۆییەکان | ل:1 |
| **ژمارەی ڕێوشوێن: 2** | **لە:1** |

| ز | هەنگاوەکان |
|---|---|
| .1 | بەرپرسی سەرچاوەکان، پێویستییەکانی دەستگاکە لە دەستی کار دیاری دەکات، لە بوارەکانی چۆنایەتی و چەندایەتی بە گوێرەی پێویستییەکانی دەستگاکە، و بە گوێرەی پلانی ستراتیجی دەستگاکە، ناوبەناو یاخود ئەگەر پێویست بکات. |
| .2 | هەروەها بڕ و ژمارەی دەستی کار دیاری دەکات. |
| .3 | بەراورد دەکات لە نێوان ئەوەی ئێستا هەیە و ئەوەی پێویستە بۆ پڕکردنەوەی کەمیی یان زیادی (العجز/ الفائض). |
| .4 | هەروەها، چۆنیەتی کارکردن لەسەر ئەوانەی زیادن، دیاری دەکات، واتە سەرچاوەکانی داپۆشینی کەمیی. |
| .5 | هەروەها ڕاپۆرتێک بەرز دەکاتەوە بۆ بەڕێوەبەری کارگێڕیی بۆ پێداچوونەوەی. |
| .6 | بەڕێوەبەری کارگێڕییش بەرزی دەکاتەوە بۆ بەڕێوەبەری گشتیی بۆ ڕەزامەندیی، و ئەمیش بەرزی دەکاتەوە بۆ ئەنجومەنی کارگێڕی بۆ ئەوەی متمانەی پێبدەن. |
| .7 | ئەنجومەنی کارگێڕی متمانە بە وەسفە وەزیفییەکە دەدات. |

| وەسفی ڕێوشوێن | |
|---|---|
| ناوی ڕێوشوێن: هەڵبژاردن و دامەزراندن | ل:1 |
| ب. ژمارەی ڕێوشوێن: 3 | لە:1 |

| | هەنگاوەکان | بەرپرسیارێتی جێبەجێکردن |
|---|---|---|
| 1. | بەرپرسی سەرچاوە مرۆییەکان بە شوێن سەرچاوەی مرۆییدا دەگەڕێت لە بازاڕی کار، ناوبەناو و کاتی پێویست. | |
| 2. | لیژنەی دامەزراندن لێکۆڵینەوە لە داواکارییەکانی دامەزراندن دەکات، و هەڵبژاردن (اختیار) و دیمانە ئەنجام دەدات، هەروەها شێوازی تر بۆ راکێشانی کارمەند، بە مەبەستی دانانی کەسی شیاو لە شوێنی شیاو. | لیژنەی دامەزراندن |
| 3. | بەرپرسی سەرچاوە مرۆییەکان ڕاسپاردەکانی بەرز دەکاتەوە بۆ بەڕێوەبەری کارگێڕی و ئەمیش لەلای خۆیەوە بەرزی دەکاتەوە بۆ بەڕێوەبەری گشتیی بۆ پەسەندکردنی، و بۆ ئەنجومەنی کارگێڕی بۆ متمانە پێدانی، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە ڕێوشوێنی دامەزراندن، ڕێنمایی کارگێڕیی. | سەرچاوەی مرۆیی |

| وەسفی ڕێوشوێن | |
|---|---|
| ث: ناوی ڕێوشوێن: دارشتنی سیستمی مووچە | ل:1 |
| ژمارەی ڕێوشوێن: 4 | لە:1 |

| ز | هەنگاوەکان |
|---|---|
| 1. | بەرپرسی سەرچاوە مرۆییەکان لێکۆڵینەوە لە پەیژەی مووچەکانی ناو ڕێکخراوەکە دەکات، و شی دەکاتەوە، ساڵانە یان کەی پێویست بکات. |

| | |
|---|---|
| 2. | هەروەها لێکۆڵینەوە لە پەیژەی مووچە لە دەستگای تری هاوشێوە دەکات، سەرەڕای پێداچوونەوەی یاسای کار و ڕێنماییەکان لەو بارەیەوە. |
| 3. | هەروەها پۆلێن بۆ توێژەکانی مووچە بۆ وەزیفەکان دادەنێت، بە گوێرەی ئاستی خوێندن و پسپۆڕیی زانستی. هێندەی پێویست جەخت دەخاتە سەر هەبوونی سیستمێکی گونجاو بۆ مووچە، کە دادپەروەرانە و بابەتییانە بێت لە هەمبەر بەها و بایەخی وەزیفە جۆراوجۆرەکانی دەستگاکە. |
| 4. | ڕاسپاردەکانی بۆ بەڕێوەبەری کارگێڕیی بەرز دەکاتەوە، ئەمیش لەلای خۆیەوە بەرزی دەکاتەوە بۆ بەڕێوەبەری گشتیی بۆ ڕەزامەندی، و ئەمیش بۆ ئەنجومەنی کارگێڕیی بۆ متمانە پێدانی. |
| 5. | بەڕێوەبەری دارایی بەدواداچوونی سیستمی مووچەی کارمەندان دەکات، و ڕاپۆرت بۆ بەڕێوەبەری کارگێڕی بەرز دەکاتەوە. |

| وەسفی ڕێوشوێن | | |
|---|---|---|
| ج: ناوی ڕێوشوێن: دارشتنی سیستمی حەوافز | | ل:1 |
| ژمارەی ڕێوشوێن: 5 | | لە:1 |
| ز | هەنگاوەکان | |
| 1. | بەرپرسی سەرچاوەکان، سیستمی حەوافزی تاکەکەسی و کۆیی شی دەکاتەوە، ساڵانە یان کەی پێویست بکات | |

| | |
|---|---|
| .2 | هەروەها، لێکۆڵینەوە و شیکردنەوە بۆ سیستمی حەوافز لە دەستگای هاوشێوە ئەنجام دەدات، سەرەڕای پێداچوونەوەی یاسای کار و ڕێنماییەکان. |
| .3 | هەروەها، سیستمێک دادەڕێژێت بۆ حەوافزی تاکەکەس و بەکۆ (مادی و رەمزی) بە ڕەچاوکردنی ئەدای گشتیی دەستگاکە، بە شێوەیەک کە وەڵامی پێویستییەکانی فەرمانبەران بداتەوە لە چوارچێوەی بەدیهێنانی ئامانجەکانی دەستگاکە. |
| .4 | ڕاسپاردەکانی بۆ بەڕێوەبەری کارگێڕی بەرز دەکاتەوە بۆ پێداچوونەوەی، ئەمیش لەلای خۆیەوە بەرزی دەکاتەوە بۆ بەڕێوەبەری گشتیی بۆ ڕەزامەندی، و ئەمیش بۆ ئەنجومەنی کارگێڕی بەرزی دەکاتەوە بۆ متمانە پێدانی. |
| .5 | هەروەها، بەدواداچوونی پیادەکردنی سیستمی حەوافز دەکات و بە تایبەت ڕاپۆرت بۆ بەڕێوەبەری کارگێڕی بەرز دەکاتەوە. |

**وەسفی ڕێوشوێن**

| | |
|---|---|
| ح: ناوی ڕێوشوێن: دانانی سیستمی خزمەتگوزاری بۆ فەرمانبەران | ل:1 |
| ژمارەی ڕێوشوێن: 6 | لە:1 |

| | |
|---|---|
| ز | هەنگاوەکان |
| .1 | بەرپرسی سەرچاوە مرۆییەکان لێکۆڵینەوە لە دڵنیایی کۆمەڵایەتی و تەندروستیی دەکات کە دەستگاکە پێشکەشی کارمەندانی دەکات، و ساڵان یان کەی پێویست بێت، شیکردنەوەی بۆ دەکات. |

| | |
|---|---|
| .2 | هەروەهـــا لێکـــۆڵینەوە لە خزمەتگوزارییەکـــانی کـــۆمەڵایەتی و تەندروسـتیی دەسـتگا هاوشـێوەکان دەکـات، و شـیکردنەوەی بـۆ دەکات، بێجگە لە پێداچوونەوەی یاسای کار و ڕێنماییەکان |
| .3 | بەرزی دەکاتەوە بۆ بەڕێوەبەری کارگێڕی بۆ پێدانی ئەم خەسڵەتانە بە کارمەندان، وەک بیمەی تەندروستی و کۆمەڵایەتی و نەخۆشی و هاتووچۆ و نیشتەجێکردن و هاوکاری و قەرز و تاد. |
| .4 | بەڕێوەبەری کارگێڕی پێداچوونەوەی دەکات و بەرزی دەکاتەوە بۆ بەڕێوەبەری گشتیی |
| .5 | بەڕێوەبەری گشتیی بەرزی دەکاتەوە بۆ ئەنجومەنی کارگێری بۆ ڕەزامەندییان. |
| .6 | بەرپرسی سـەرچاوە مرۆییەکان بەدواداچـوونی خزمەتگوزارییەکـان دەکات و ڕاپۆرت بەرز دەکاتەوە بۆ بەڕێوەبەری کارگێڕی. |

| **وەسفی ڕێوشوێن** | |
|---|---|
| خ: ناوی ڕێوشوێن: هەڵسەنگاندنی ئەدا | ل:1 |
| ژمارەی ڕێوشوێن: 7 | لە:1 |

| | |
|---|---|
| ز | هەنگاوەکان |
| .1 | بەرپرسی سەرچاوە مرۆییەکان لێکۆڵینەوە لە سیستمی هەڵسەنگاندنی ئەدا دەکات، ناوبەناو و کەی پێویست بکات. |
| .2 | سیستمی دەستگاکە بەراورد دەکات لەگەڵ سیستمی هەڵسەنگاندن لە دەستگای تری هاوشێوە. |
| .3 | سیسـتمێکی کـارا دادەڕێژێـت بـۆ هەڵسـەنگاندن بـۆ زانینـی ئەدای فەرمانبەر و زانینی کەموکوڕییەکانی ئەدا |

| | |
|---|---|
| .4 | ڕاسپاردەکانی بەرز دەکاتەوە بۆ بەڕێوەبەری کارگێڕی بۆ پێداچوونەوەی، ئەمیش بەرزی دەکاتەوە بۆ بەڕێوەبەری گشتیی بۆ وەرگرتنی ڕەزامەندی |
| .5 | بەڕیوەبەری گشتیی بەرزی دەکاتەوە بۆ ئەنجومەنی کارگێڕی بۆ وەرگرتنی متمانەیان. |
| .6 | بەرپرسی سەرچاوە مرۆییەکان ئەو سیستمی هەڵسەنگاندنەی کە متمانەی پێدراوە، جێبەجێ دەکات. ئەنجامەکانی هەڵسەنگاندن و راسپاردەکان بەرز دەکاتەوە بۆ بەڕێوەبەری کارگێڕی بۆ پێداچوونەوەی، ئەمیش بەرزی دەکاتەوە بۆ بەڕێوەبەری گشتیی بۆ ئەوەی رێوشوێنی پێویست بگرێتە بەر، وەک بەرزکردنەوەی پلە، سەرنجراکێشان، چەسپاندن، تاد. |

| | |
|---|---|
| **وەسفی ڕێوشوێن** | |
| د. ناوی رێوشوێن: مەشق و گەشەپێدانی کارگێڕی | ل:1 |
| ژمارەی رێوشوێن: 8– ئەم رێوشوێنە پشت دەبەستێت بە راسپاردە و راوێژی بەردەوام لەگەڵ بەڕێوەبەری کارگێڕی و بەڕێوەبەرەکانی بەشەکانی دەستگاکە | لە:1 |

| | |
|---|---|
| ژ | هەنگاوەکان |
| .1 | بەرپرسی سەرچاوە مرۆییەکان و بە ڕاوێژ لەگەڵ بەڕێوەبەری بەشەکان و بەڕێوەبەری دارایی، ئامانجەکان و سیاسەتە گشتییەکان و ستراتیجەکانی مەشق و ڕاهێنان دادەنێت. |
| .2 | لە رێی ڕاسپاردەی بەشەکانی ترەوە، بەرپرسی سەرچاوە مرۆییەکان، پێویستییەکانی مەشق بۆ کارمەندان دیاری دەکات، |

| | |
|---|---|
| ئەمەش لە رێی دابەشکردنی ڕاپرسی ناوبەناو یان کاتی پێویست سەبارەت بە پێویستبوونی مەشق بە کارمەندێک، پێشکەشکردنی خزمەتگوزارییەکی نوێ، یان پرۆژەیەکی نوێ. | |
| هەروەها، پلان بۆ مەشقەکان و بەرەوپێشبردنیان دادەنێت، بە شیوەیەک کە بتوانێت وەڵامی پێویستییەکانی هەر چالاکییەک بداتەوە. | 3. |
| هەروەها کار دەکات بۆ دیاریکردنی بەرنامە گشتی و تایبەتییەکان بۆ وەڵامدانەوەی پێویستییەکانی مەشق، و کامەیان جێبەجێ دەکرێت و کامەیان بە هاوبەشی لەگەڵ لایەنێکی دەرەکیدا ئەنجام دەدرێت. | 4. |
| هەروەها، لێکۆڵینەوە لە عەرزی دەستگاکانی مەشق دەکات و باشترینیان هەڵدەبژێرێت. | 5. |
| هەروەها، ئامادەکاری بۆ بودجەی پلاندانان و مەزەندەیی بۆ مەشقەکان دەکات. | 6. |
| ڕاپۆرت لەسەر چالاکیی مەشقدراوەکان و مەشقدەرەکان و ئەدای دەستگا مەشقدەرەکە پێشکەش بە بەڕێوەبەری کارگێری دەکات. | 7. |
| سەرپەرشتیی ئامادەکاری بۆ بەرنامەکانی مەشق و مادەکانی دەکات. | 8. |
| بەدواداچوون بۆ ئەو کارمەندانە دەکات کە بۆ خولی تایبەت یان کۆنگرە ڕەوانە کراون. | 9. |
| بە هەماهەنگی لەگەڵ بەڕێوەبەری کارگێری کار دەکات بۆ وەرگرتنی فەند لەو دەستگا پەیوەندیدارانەی هانی مەشق دەدەن. | 10. |
| هەروەها سەرپەرشتیی هەبوونی پیویستییەکانی مەشق دەکات، وەک ئامرازی بینین و بیستن و کەرەستەی جۆراوجۆری مەشق. | 11. |

## 5. فۆرمەكان

### ئەم بەشە چەند فۆرمێک لەخۆدەگرێت، وەک:

**أ_كارتی وەسفی وەزيفی:**

| كارتی (وەسفی وەزيفی، Job Description) |
| --- |
| يەكەم: پێناسەی وەزيفەكە:<br>ناوی وەزيفەكە:<br>شوێنی وەزيفەكە:<br>ناوی وەزيفەی سەرۆكی ڕاستەوخۆ:<br>ئەو بەركارانەی ئەم وەزيفەيە لێيان بەرپرسە:<br>پسپۆڕيی گشتيی: |
| دووەم: ئەركەكان و بەرپرسيارێتييەكان:<br>– |
| سێيەم: پەيوەنديیە وەزيفييەكان:<br>– |
| چـوارەم: لای كەمـی شايسـتەيی بـۆ وەرگرتنـی ئەو كەسـەی ئەم پۆسـتە پـڕ دەكاتەوە:<br>شايستەيی:<br>پسپۆڕيی:<br>زانينی زمان:<br>كارزانی تايبەت و مەشق:<br>–<br>– |

## ب_فۆرمی پلاندانان بۆ کار:

| پلاندانان بۆ کار[1] | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| پێویستییەکان | | بەردەست (متوفر) | | کەمیی/زیادی | | ڕاسپاردە | |
| چەندایەتی | چۆنایەتی | چۆنایەتی | چەندایەتی | چۆنایەتی | چەندایەتی | چەندایەتی | چۆنایەتی |
| | | | | | | | |
| | | | | | | | |
| | | | | | | | |
| | | | | | | | |

## ت_فۆرمی دەستنیشانکردنی پێویستییەکانی مەشق

| فۆرمی دەستنیشانکردنی پێویستییەکانی مەشق | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ناوی کەس | ناوی وەزیفە | مەشقی پێویست | ئامانجی مەشقەکە | ماوە و شوێنی مەشق | کوالفەی مەزندەکراو |
| | | | | | |
| | | | | | |
| | | | | | |
| | | | | | |

[1] ئەم فۆرمە بەکاردەهێنرێت بۆ دەستنیشانکردنی پێویستییە لۆجیستییەکان بۆ دامەزراندنی فەرمانبەرێکی نوێ، وەک کەلوپەلی ناو ژوور و قەرتاسییە و هی تر هەر کاتێک فەرمانبەرەکە دەستی بە کارەکانی کرد.

# فۆرمی پابەندیی مەشقپێكراو:

**نامەی پابەندێتیی (التزام) بۆ مەشقپێكراو**

مێژوو:

بۆ بەڕێز ............

دەستگاكەمان كارزانی و تواناكانی بەڕێزتان لە كارەكەتدا بەرز دەنرخێنێت، ئێمە وەك دەستگاكەمان پابەندین بە دابینكردنی دەرفەت بۆ بەڕێزتان و هاندانت بۆ بەرفراوانكردنی كارزانی و پسپۆڕیت.

مایەی خۆشحاڵیمە پێتان ڕابگەیەنم كە بەڕێزتان دیاری كراون بۆ بەرنامەی مەشق، كە هەموو خەرجییەكان لە لایەن دەستگاكەوە دابین دەكرێت.

ناوی بەرنامە

مەشق:________________________________

مێژوو:________________________________

شوێن: ________________________________

كولفە:________________________________

**ئامانجی ئەم مەشقە بریتییە لە پتەوكردنی تواناكانت وەك بەشێك لە تیمی كاری دەستگاكەمان، و پتەوكردنی دەستگاكە، تكایە ئەم مەرجانەی خوارەوە بە وردی بخوێنەرەوە:**

1. بە واژووكردن ڕەزامەندی خۆت دەردەبڕیت لەسەر ئەوەی مەشقەكە بۆ بەرژەوەندی دەستگاكەیە، و پابەند دەبیت بە مەرجەكانییەوە.
2. هەڵبژاردنی ژمارە 1. ) كولفەی تا 1500دۆلاری ئەمریكی (بەم مەرجانە:)

أ- (پابەند دەبیت بە تەواوكردنی كارەكەت لە دەستگاكە وەك --------- بۆ ماوەی شەش مانگ پاش گەڕانەوەت لە مەشقەكە).

ب( ڕەزامەندی دەدەیت كە ئەگەر وازت لە كارەكەت هێنا یان ئەگەر كارێكی ناشایستەت كرد كە دەستگاكە ناچار بێت دەرت بكات لە كار لەو ماوەیەدا كە لە خاڵی أ لە سەرەوە باس كراوە، ئەوسا پارەی هەموو خەرجییەكانی مەشقەكە دەگەڕێنیتەوە، بۆ نموونە، ئەگەر دوای چوار مانگ لە

گەڕانەوەت بۆ سەر کارەکەت وازت هێنا ئەوسا بڕی ١٠٠٠ دۆلار دەگەڕێنیتەوە بۆ دەستگاکە بەو پێیەی کە 1500دۆلار× 8مانگ ) 12مانگ- 4مانگ( 12/ شهر = 1000دۆلاری ئەمریکی ).

3. هەڵبژاردنی ژمارە 2. )تێچووی زیاد لە 1500دۆلاری ئەمریکی (بەم مەرجانە):

أ- (پابەند دەبیت دەست بکەیتەوە بە کار لە دەستگاکە بۆ ماوەی .... ساڵێك پاش تەواوبوونی ماوەی مەشق)

ب- (ڕەزامەندی دەدەیت کە ئەگەر وازت لە کارەکەت هێنا یان ئەگەر کارێکی ناشایستەت کرد کە دەستگاکە ناچار بێت دەرت بکات لە کار لەو ماوەیەدا کە لە خاڵی أ لە سەرەوە باس کراوە، ئەوسا پارەی هەموو خەرجییەکانی مەشقەکە دەگەڕێنیتەوە، بۆ نموونە، ئەگەر دوای چوار مانگ لە گەڕانەوەت بۆ سەر کارەکەت وازت هێنا ئەوسا بڕی4445دۆلار دەدەیت بەو پێیەی کە 5000دۆلار× 32مانگ ) 32مانگ- 4مانگ ( 36/مانگ = 4445دۆلاری ئەمریکی.

لەگەڵ پیرۆزباییم لێتان بۆ ئەم دەرفەتە و هیوادارم سوودی لێ ببین بۆ دەستگاکە لە پاش گەڕانەوەتان لە مەشقەکە.

لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێز و پێزانین
بەڕێوەبەری گشتیی

---

بە واژوو کردنی ئەم بەڵگەنامەیە، بڕیار دەدەم کە بەڵگەنامەکەم خوێندۆتەوە و لە مەرجەکانی تێگەیشتووم سەبارەت بە خولی مەشقەکە کە دەستگاکە بۆی فەراهەم کردووم، و وەك لەم نامەیەدا هاتووە و رەزامەندم بە مەرجەکان.

ناوی مەشقپێکراو

---

- **واژووی مەشقپێکراو**

---

- **مێژوو**

# سەرچاوەكان

## بە ئینگلیزی


1- Human resource management in Non-profit sector
http://www.e-elgar.com/shop/eep/preview/book/isbn/9780857937308/

2- Human Resource Management
www.bized.co.uk

3- Managing Human Resources in Entrepreneurial Firms
Pearson Education, Inc. publishing as Prentice Hall


## بە عەرەبی


- دور ادارة الموارد البشرية في التطوير المؤسسي IDMC
- ادارة الموارد البشرية واهميتها في تطوير الادارة ، الامم المتحدة ، اللجنة الاقتصادية والاجتماعية لغربي اسيا
- محاضرات ادارة المشاريع الصغيرة ، هاني عرب ، ملتقى البحث العلمي

